دان و ئاو. ماکەوێکی بێوەژنی تەنیاو ڕەشپۆش.
ماکەوی ژنە بازێکی لەبیر کراو!
" ئاگادارییەك لەماکەوە ڕەشپۆشەکانەوە"
(ئەگەر لە ترسی گەڕانەوەی ئەرژەنگی دێو نەبوایە
ئەگەر لە ترسی گەڕانەوەی دۆلٚپای تاعوونی بەغدا نەبوایە
ئێمەی ماکەوە ڕەشپۆشە برسیەکانی ئەم قەلٚەم ڕەوە
هاوسەرو خوشك و دایکی و بازە پەڕ و باڵ خوێناوییەکان
بەدەنووك و بەدەنووك و بەدەنووك
سەدان چاومان هەلٚ ئەکۆلٚی و ئەشمان خواردن!)
بازەکەی من!
ئیستە ڕۆحم قاقرێکەو خۆلٚی سووری تیا ئەبارێ
تۆزێکی وورد. کەتیرەیی. ئەملکێنێ بە غوربەتێکی تازەوە
بەتوترکی هەزار پرسیاری تازەوە..
" ئەترسم..ئەترسم..ئەترسم
لەم خۆلٚە سورە ئەترسم
لە پشت ئەم خۆلٚە سورەوە چیتر هەیە؟!
کێ لەخوێن ئەکۆلٚێتەوە؟!
کێ دادگایی من ئەکات؟!
کێ سەر لەم قەفەزانە ئەدات؟!
گولٚە ڕەشەکان چۆن ئەژین؟!
گولٚە ڕەشەکان چۆن ئەمرن؟!
ئەم دەرگای سەر برینانە

کێ لەم دەرگایانە ئەدات؟!
ئەم هێلانەی بازو داڵانە چۆن تێکەڵ
بەیەکتر بوون؟!
ئەترسم. ئەترسم، ئەترسم
لەم خۆڵە سورە ئەترسم
ئەم چەقۆیانە چۆن هاتنە
ناو بەرۆکی سپیمەوە؟!
ئەو گوڵکوژانە چۆن ئێستا
لەگەڵ گوڵدا هەڵ ئەپەڕن؟!
ئەم دزانە بە کوێدا هاتنە ژوورەوە؟
چۆن گەیشتنە سەر چرپاکەم؟
ئەو ئەسپانەیان چۆن خەساند؟
ئەو کێوە زلە چۆن دزرا؟
چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟"
من بازەکەم گوڵکۆیەکی دیاری نییە
لەسینەم و ئەو گوڵجارانە بەولاوە
کە مێرگی سوور
کە دەشتی سوور ئەنووسنەوە
من بازەکەم گوڵکۆیەکی دیاری نییە
هەتا منیش وەك ژنە هەوری ئەم شارە
هەوری ڕەشپۆش
هەمووی ڕۆژانێکی هەینی

خەمەکانم کۆکەمەوە و

بچم بەسەریا ببارێم

من دار هەنارێکم هەیە تەنیا

تەنیا و تەریك

هەر خۆی و خۆی

والە باکوری ئەم شارە

هەموو ڕۆژانێکی شەممە

هەر خۆم و خۆم

ئەچم بۆلای، منیش وەك ئەو

هەر بەپێوە ڕائەوەستم، هەتا بوولێڵ

چاو ئەبڕمە قەدوبالآی، ماچی ئەکەم

دەستی ساردم ئەخەمە سەر شانەکانی و

هەڵ ئەلەرزێم وەکوو گەلآی

یەکەم جار بوو

ئەم دار هەنارە تەنیایە

ئەم هاوڕێ گۆشە گیرە

لە شەمەیەکی زیوینی بەر باراندا

لەسەر قەدی، لەسەر سنگی

لەسەر دەستی

شیعری یەکەمین ژوانی

من و بازەکەمی نووسی!..

هەموو ڕۆژانێکی شەممە ئەچم بۆلای

منیش وەك ئەو هەر بەپێوە ڕائەوەستم
هەتا بوولێڵ
ئەوسا ئیتر وەکوو خەمێکی قژ درێژ
وەك ماکەوێکی ڕەشپۆشی
تەنیا و بێزار
دائەگەڕێم و ئەچمەوە
بۆ ناو قەفەزی ژوورێکی
دامێنی شار!

# ناوەڕۆك